

# الأَرْبَعُونَ الحَلَقَاتُ القُرْآنِيَّة



جَمْعُ وَ تَرْتِيب

عَبْدُ اللَّطيف حاج نَجيب

وەرگێڕانی : باوکی هاجەرە

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: الأَرْبَعُونَ الحَلَقَاتُ القُرْآنِيَّة

داناني: عبداللطيف حاج نجيب

وەرگێڕانی: م. باوکی هاجەرە

نەخشەسازی کتێب: أبو عمرو



## فەرموودەی یەکەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**﴿بُنِـــيَ الْإِسْــلَامُ عَلَى خَمْسٍ : شَــهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُــولُ اللَّهِ، وَ إِقَـامِ الصَّــلَاةِ، وَ إِيتَـاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ﴾** مُتَّفَقٌ عَليه

**واتـــای فەرمــــوودەکە** ﴿ ئاییني ئیسلام دامەزراوە لەسـەر پێـنج کـۆڵەگەو پـایە، شــایەتی دان کەهــیچ پەرســتراوێک نیــیە بەحەق وڕاســـتی بـــێجگە لە اللَّهُ تَعَـــالَى، وە مـــوحەممەد پێغەمـــبەری اللَّهُ تَعَـالَى یـــە، وە بەرپــاکردن و ئەنجامــدانی نــوێژ، وە دانــی زەکــات وە حەج کردن وە بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان ﴾

### واتای وشەکان

بُنِيَ : بونیادنراوە، دروست کراوە

الْإِسْلَام : ئاییني ئیسلام

عَلَى : لەسەر

خَمْسٍ : پێنج شت، پێنج کۆڵەگەو ڕوکن



شَهَادَةِ : شايەتیدان، شايەتومان

لَا إِلَهَ : هیچ پەرستراو و مَعْبُودێک نیە

إِلَّا اللَّهُ : جگە لە اللَّهُ تَعَالَى

وَأَنَّ : وە بێگومان

مُحَمَّدًا : پێغەمبەر موحەممەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

رَسُولُ اللَّهِ : نێردراوی اللَّهُ تَعَالَى

وَإِقَامِ الصَّلَاةِ: جێبەجێ کردن و بەرپاکردنی نوێژ

إِيتَاءِ الزَّكَاةِ : بەخشین و پێدانی زەکات

الْحَجِّ : حەجکردن

صَوْمِ رَمَضَانَ : وە بەڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزان





## فەرموودەی دووەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ ﴾ رَواهُ البُخاري

**واتـــای فەرمووده‌کـــه** ﴿ باشـترین کەسـتان ئەو کەسـەیە کەوا خۆی فێرە قورئان کردووەو خەڵکیش فێرە قورئان دەکات ﴾

### واتای وشەکان

خَيْرُكُمْ : باشترینتان، باشترین کەستان

مَنْ : ئەو کەسەیە

تَعَلَّمَ : خۆی فێرکردووە

تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ : خۆی فێرە قورئان کردووە

وَعَلَّمَـــهُ : وەخەڵکیشـــی فێرکـــردووە، ئەو هـــائە بـــۆ الْقُـــرْآنَ دەگەڕێتەوە







## فەرموودەی سێیەم

قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**﴿ إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ ﴾**

رواه البخاري

**واتـــــای فەرمـــــوودەکە** ﴿ ئەگەر یەکێـک لە ئێـوە هـاتە نـاو مزگەوت با دانەنیشێت تاوەکوو دوو ڕکات نوێژ دەکات ﴾

### واتای وشەکان

إِذَا : ئەگەر

دَخَلَ : هاتە ناو، داخیل بوو

أَحَدُكُمُ : یەکێک لە ئێوە

الْمَسْجِدَ : مزگەوت، جەمع و کۆی مَسْجِد بریتییە لە مَسَاجِد

فَلَا يَجْلِسْ : با دانەنیشێت

حَتَّى : هەتا، تاوەکوو

يُصَلِّيَ : نوێژ دەکات

رَكْعَتَيْنِ : دوو ڕکات

يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ : دووڕکات نوێژ دەکات









كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إذا أوَى إلى فِراشِهِ، قالَ:

**﴿ اللَّهُمَّ باسْمِكَ أَحْيا و أمُوتُ ﴾**

وَإِذَا أَصْبَحَ قَالَ **﴿ الحَمْدُ لِلَّهِ الذي أحْيانا بَعْدَ ما أماتَنا وإِلَيْهِ النُّشُورُ ﴾** رواه البخاري

**واتای فەرموودەکە** ﴿ پێغەمبەر صَلَّى اللّٰهُ عليه وسلَّمَ ئەگەر هاتبوایە لای جێگای خەوەکەی دەیفەرموو: ئەی اللَّه بەناوی تۆ دەژیم و دەمرم ﴾

وە ئەگەر بەیانی هاتبا و هەستابوایە لەخەو دەیفەرموو ﴿هەموو سوپاس و ستایشێک بۆ ئەو اللَّه یەی کە زیندووی کردینەوە دوای ئەوەی مراندینی، وە هەر بۆ لای ئەویش زیندوو دەکرێینەوە لە ڕۆژی قیامەت ﴾







## واتای وشەکان

كانَ : بوو

النبيُّ : پێغەمبەر صَلَّى اللّٰهُ عليه وسلَّم

إذا : ئەگەر

أوَى : بهاتایە، خۆی أوَى فیعلي ماضییە و بەواتای أَتَى دێت ، أَتى واتا هات

إلى : بۆ

فِراشِهِ : جێگایەکەی، جێگای نوستنەکەی (هائەکە دەگەڕێتەوە بۆ النَّبي صلى الله عليه وسلم)

قالَ : دەیفەرموو( پێغەمبەر )

اللَّهُمَّ : ئەی اللّٰه

باسْمِكَ أَحْيا و أمُوتُ : بەناوی تۆ دەژیم و دەمرم

باسْمِكَ : بەناوی تۆ

أَحْيا : دەژیم، خۆی أَحْيا فیعلي ماضییە بەواتای ژیام دێت

وأمُوتُ : وە دەمرم

وَ إذَا : وە ئەگەر

أَصْبَحَ : بەیانی کردبوایەوە، هەستابوایە لەخەو، بکەوتایە کاتی بەیانی

قَالَ : دەیفەرموو







الحَمْدُ لِلَّهِ الذي : هەموو سوپاس و ستایشێک بۆ ئەو اللَّه یەی

أحْيانا : زیندووی کردینەوە ، بەئاگای هێنایەنەوە

بَعْدَ ما : دوای ئەوەی

أماتَنا : ئێمەی مراند ، ئێمەی خەواند

وإلَيْهِ : وە بۆ لای ئەوە، بۆ لای اللَّه یە، هائەکە دەگەڕێتەوە بۆ اللَّه

النُّشُورُ : زیندووبوونەوە لە ڕۆژی قیامەت دا

النَّوْمُ مَوْتٌ خَفيفٌ : خەوتن مردنێکی سووکە

والمَوْتُ نَوْمٌ ثَقيلٌ : وەمردن خەوێکی قورسە

النَّوْمُ أَخُ المَوْتِ : خەوتن برای مردنە







## فەرموودەی پێنجەم

كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذا دَخَلَ الخَلاءَ قَالَ:

﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ ﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتـــای فەرمـــوودەکە** ﴿ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەگەر ویستبای بچێتە ئاو دەست دەیفەرموو ﴿ ئەی اللَّه تعالى من خۆم دەپارێزم بەتۆ لە شەیاتینە نێرینەکان ولە شەیاتینە مێیینەکان ﴾

### واتای وشەکان

اللَّهُمَّ = یا الله، ئەی الله تعالى

إِنِّي = بێگومان من

أَعُوذُ = خۆم دەپارێزم، پەنا دەگرم

بِكَ = بە تۆ

مِنَ الْخُبُثِ = لە شەیاتینە نێرینە پیسەکان

وَالْخَبَائِثِ = وە شەیاتینە مێینە پیسەکان







## فەرموودەی شەشەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿مَنْ تَوَضَّأَ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ﴾ رواه مسلم

**واتای فەرموودەکە** ﴿ هەر کەسێک دەستنوێژی هەڵگرت، بە جوانترین و باشترین دەست نوێژ هەڵگرتن، تاوانەکانی دەڕوات و دەردەچێت لەجەستەی هەتا تاوانەکانی دەردەچێت لەژێر نینۆکەکانیشی ﴾

### واتای وشەکان

مَنْ : هەر کەسێک

تَوَضَّأَ : دەستنوێژی هەڵگرت

فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ : باشترین و جوانترین دەست نوێژ هەڵگرتن، بەدەستنوێژگرتنێکی چاك و تەواو





الْوُضُــوءَ : دەســتوێژ، الْوَضُــوءَ بە فەتــحەی واوەکە واتــا ئــاوی دەست نوێژ

خَرَجَتْ : دەردەچێت ، دەڕوات

خَطَايَاهُ : تاوانەکانی، ئەو هائە بۆ مَنْ دەگەڕێتەوە

مِنْ : لە

جَسَدِهِ : جەستەی، هائەکە بۆ مَنْ دەگەڕێتەوە

حَتَّى : تاوەکوو

تَخْرُجَ : دەردەچێت و دەڕوات ( تاوانەکانی )

مِنْ : لە

تَحْتِ : ژێر

أَظْفَارِهِ : نینۆکەکانی، ئەم هائە بۆ مَنْ دەگەڕێتەوە








قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ ﴾ مُتَّفَقٌ عَليه

**واتـــــاى فەرمــــــوودەكە** ﴿ لەنـاوچوون و ئـاگرى دۆزەخ بـۆ ئەو كەسانەى لە شۆرينى پاژنە پێيان كەم و كوڕيان هەيە ﴾

## واتاى وشەكان

وَيْلٌ : دۆڵێک لە دۆزەخ، لەناوچوون

لِلْأَعْقَـابِ : بـۆ ئەو پـاژنە پێيـانەى (لەكـاتى دەسـتنوێژ تەڕنـابن) أَعْقَـاب جەمـع و كـۆى عَقِـب يـيە عَقِـب واتـا پـاژنە پـێ ، وە كۆتـايى هەر شتێک پێى دەوترێت عَقِب

مِنَ : لە

النَّارِ : ئاگر









عَـنْ سَـالِمٍ مَـوْلَى شَـدَّادٍ، قَـالَ دَخَلْـتُ عَلَى عَائِشَـةَ زَوْجِ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَـوْمَ تُـوُفِّيَ سَـعْدُ بْـنُ أَبِـي وَقَّـاصٍ، فَـدَخَلَ عَبْـدُ الـرَّحْمَنِ بْـنُ أَبِـي بَكْـرٍ، فَتَوَضَّـأَ عِنْـدَهَا، فَقَالَـتْ : يَـا عَبْـدَ الـرَّحْمَنِ، أَسْـبِغِ الْوُضُـوءَ، فَـإِنِّي سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَقُولُ ﴿وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ﴾

**واتــــاکەی**: لە سـالمی مەولای شـەددادەوە، فەرمـوویەتی چـوومە لای دایە عائیشـەی خێزانـی پێغەمـبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لەو ڕۆژەی سـەعدی کـوڕی ئەبـی وەقـاص وەفـاتی کـرد ، جـا عبـد الـرحمن ی کـوڕی ئەبـو بەکـری صـدیق هـاتە لای دایە عائیشـە، جـا عبـد الـرحمن دەسـتنوێژی هەڵگـرت لەلای دایە عائیشـە، دایە عائیشـە فەرمـووی دەسـت نـوێژ تەواو و چـاک هەڵگـرە ، بێگومـان مـن گـوێم لە پێغەمـبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بـوو دەیفەرمـوو ﴿دۆڵێـک لەدۆزەخ بـۆ ئەو کەسـانەیە لە شـۆرینی پـاژنە پێیـان کەم و کووڕیان هەیە﴾





## فەرموودەی هەشتەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ تَبْلُغُ الْحِلْيَةُ مِنَ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الْوَضُوءُ ﴾ رواه مسلم

**واتـــــای فەرمـــــــوودەکە** ﴿ جــوانی و گەشــاوەیی لە کەســی بڕوادار تا ئەو شوێنە دەڕوات کە ئاوی دەستنوێژی دەگاتێ ﴾

**واتای وشەکان**

تَبْلُغُ : دەگاتێ

الْحِلْيَةُ : جوانی و گەشاوەیی

مِنَ الْمُؤْمِنِ : لە ئیماندار

حَيْـثُ يَبْلُـغُ الْوَضُـوءُ : تــا ئەو شــوێنانەی ئــاوی دەســت نــوێژی دەگاتێ

حَيْثُ : تا ئەو شوێنەی، حَيْثُ ظەرفە بۆ يَبْلُغُ

يَبْلُغُ : دەگاتێ

الْوَضُوءُ : ئاوی دەستنوێژی





الْوَضُوءُ : ئاوی دەستنوێژ (بە فەتحی واو)

الْوُضُوء : کرداری دەستنوێژ ( بە ضەممی واو)

تَبْلُغُ ویَبْلُغُ لەم فەرموودەیەدا یەک واتایان هەیە ، وشەی الْحِلْيَةُ مێینەیە بۆیە تَبْلُغُ بەکار هێنراوە، وە وشەی الْوَضُوءُ نێرینەیە بۆیە يَبْلُغُ بەکارهێنراوە







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلَاتُهُ، فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ ﴾[1] رواه الترمذي

**واتای فەرموودەکە** ﴿ بێگومان یەکەم شتێک بەندە لێپرسینەوەی لێ بکرێت دەربارەی لە ڕۆژی قیامەت دا لە کردەوەیدا نوێژەکەیەتی، ئەگەر نوێژەکەی باشبوو "بەرێک و پێکی کردبوونی" ئەوە سەرکەوتوو و ڕزگاربووە، وە ئەگەر نوێژەکەی خراپ بوو بەرێک و پێکی نەیکردبوو ئەوە بەتبەخت بووە و زەرەر مەندبووە ﴾

## واتای وشەکان

إِنَّ : بێگومان

أَوَّلَ مَا : یەکەم شتێک



[1] ئەم فەرموودەیە زانایان جیاوازن لە صەحیحی و ضەعیفی یەکەی دا





يُحَاسَـبُ بِـهِ : لێپرسـینەوەی لەسـەر بکرێـت، هـائەکە بـۆ مـا دەگەڕێتەوە

الْعَبْدُ : بەندە

يَوْمَ الْقِيَامَةِ : لەڕۆژی قیامەت

مِنْ عَمَلِهِ : لەکردەوەیدا

صَلَاتُهُ : نوێژەکەیەتی

فَإِنْ : جا ئەگەر

صَلُحَتْ : نوێژەکانی باشبوو، بەتەواوی کردبوونی

فَقَدْ : ئەوە بێگومان

أَفْلَحَ : سەرکەوتوو بووە و سەرفراز بووە

وَأَنْجَحَ : وە نەجاتی بووە ، ڕزگاریبووە

وَإِنْ : وە ئەگەر

فَسَدَتْ : نوێژەکەی خراپ بوو، بەتەواوی نەیکردبوون

فَقَدْ : ئەوە بێگومان

خَـابَ : بەدبەخـت بـووە، بێـبەش کـراوە لە سـەرفرازی و سەرکەوتن، زەرەر مەندبووە

وَخَسِـرَ : وە زەرەر مەنـد بـووە، خەسـارەتمەند بـووە، لەدەسـتی داوە





## فەرموودەی دەیەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ[٢] فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللَّهِ﴾ رواه مسلم

**واتـــای فەرمـــوودەکە** ﴿ هەر کەسێک نوێژی بەیانی کرد، ئەوە ئەو کەسە لە ژێر پاراستنی و سپاردەی الله تعالی دایە(لە دونیا و قیامەت دا) ﴾

### واتای وشەکان

مَنْ : هەر کەسێک

صَلَّى الصُّبْحَ : نوێژی بەیانی کرد

فَهُوَ : ئەو کەسە

فِي ذِمَّةِ اللَّه : لە پاراستنی الله یە

ذِمَّة : پەیمان، پاراستن، ئەستۆ

---

[٢] **صَلَّى الصُّبْحَ** : هەندێک لەزانایان پێیان وایە ئەو کەسە لەژێر پاراستن و پەیمانی الله تعالی یە ئەگەر نوێژی بەیانی بە جەماعەت کردبێت، بەڵام لە وتەی ڕاستر گرنگ ئەوەیە نوێژی بەیانی کردبێت ، ئەوەش ظاهیری فەرموودەکە یە



## فەرموودەی یازدەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ بَشِّرِ المشَّائينَ في الظُّلَمِ إلى المَسَاجدِ بالنُّورِ التَّامِّ يومَ القيامةِ ﴾ [٣] رواه الترمذي و أبو داود و ابن ماجه، وَقالَ التِّرْمِذِيُّ هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ

**واتای فەرموودەکە** ﴿ موژدە بدەن بەو کەسانەی زۆر هەنگاو دەنێن لە تاریکییەکانی شەودا بەرەو مزگەوتەکان، بە نوور و ڕووناکیەکی تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا ﴾

**واتا**: ئەوانەی کە بەتاریکی دەچن بۆ مزگەوتەکان لەڕۆژی قیامەت ڕووناکیەکی تەواویان پێدەدرێت لەلایەن اللە تَعالَى يەوە، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى { نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَاۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ }[سورة التحريم: ٨]

---

[٣] ئەلبانی ئەم فەرموودەیەی بە صەحیح داناوە، بەڵام لە ڕاستی دا فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە وەک پێشەوا عوقەیلی و ابن الجوزي و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و زۆری تریش باسیان کردووە

وَقَالَ الدَّارُقُطْنِي: تَفَرَّدَ بِهِ إِسْمَاعِيلُ أَبُو سُلَيْمَانَ الْكَحَّالُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ أَوْس





## واتای وشەکان

بَشِّر : موژدە بدە، مەبەست تێیدا جەمعە واتا موژدە بدەن

المشَّـــائينَ : بەو کەســـانەی هەنگـــاوی زۆۆر دەنـــێن، المشَّـــائينَ جەمع و کۆی المَشَّاء یە بەواتای زۆر ڕۆیشتن دێت

في الظُّلَـمِ : لە تاریکیەکـانی شــەودا، الظُّلَـمِ جەمـع و کـۆی ظُلْمَـة یە، ظُلْمَة بەواتای تاریکی دێت

إلى : بۆ لای

المَسَـاجِدِ : مزگەوتەکـان، المسـاجد جەمـع و کـۆی مَسْـجِد ە واتـا مزگەوت ، بەواتای شوێنی سەجدە بردنیش دێت

بالنُّورِ : بە نوور و ڕووناکی

التَّامِّ : تەواو

يَوْمَ القِيامَةِ : لەڕۆژی قیامەت





## فەرموودەی دووازدەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ إِنَّ أَعْظَمَ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلَاةِ أَبْعَدُهُمْ إِلَيْهَا مَمْشًى فَأَبْعَدُهُمْ ﴾ رواه مسلم

**واتای فەرموودەکە** ﴿ بێگومان گەورەترینی خەڵکی لە ئەجر و پاداشت لەنوێژدا دوورترینیانە لە نێوان و ماوەی ڕۆیشتنیان بۆ نوێژی مزگەوت پاشان دوورترینیانە ﴾

## واتای وشەکان

إِنَّ : بێگومان

أَعْظَمَ : گەورەترینی

النَّاسِ : خەڵکی

أَجْرًا : لە ئەجر پاداشت

الصَّلَاةِ : نوێژ

أَبْعَدُهُمْ : دوورترینیانە، وشەی هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ النَّاس

مَمْشًى : شوێنی ڕۆیشتن، مَمْشًى اسم مكان ە

فَأَبْعَدُهُمْ : پاشان دوورترینیانە، ئەو فائە لێرەدا بەواتای ثُمَّ دێت، ثُمَّ واتا لەپاشان، وشەی هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ النَّاس







## فەرموودەی سێزدەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ، فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ، فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ ﴾ رواه مسلم

**واتای فەرموودەکە** ﴿ هەر کەسێک نوێژی عیشای کرد بە کۆمەڵ، وەک ئەوە وایە نیوەی شەوەکە هەستابێت شەونوێژی کردبێت، وە هەرکەسێک نوێژی بەیانی کرد بە کۆمەڵ، وەک ئەوە وایە هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێت ﴾

### واتای وشەکان

مَنْ : هەر کەسێک

صَلَّى الْعِشَاءَ : نوێژی عیشای کرد

صَلَّى : نوێژی کرد

فِي جَمَاعَةٍ : بەکۆمەڵ

فَكَأَنَّمَا : وەکو ئەوە وایە







قَامَ : هەستابێت ( وەستابێت بۆ شەونوێژ کردن )

نِصْفَ : نیوەی

اللَّيْلِ : شەوەکە

وَمَنْ : وە هەر کەسێک

صَلَّى الصُّبْحَ : نوێژی بەیانی کرد

فِي جَمَاعَةٍ : بەجەماعەت

فَكَأَنَّمَا : وەکو ئەوە وایە

صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ : تەواوی شەوەکە نوێژی کردبێت

كُلَّـــهُ : هەمـــووی، هەمـــوو شـــەوەکە، ئەو هـــائە دەگەڕێـــتەوە بـــۆ اللَّيْلَ







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**﴿ إنَّ مِـنْ أَفضـلِ أيَّـامِكُم يَـومَ الجُمعـةِ، فـأكْثِروا عليَّ مـنَ الصَّلاةِ فيهِ، فإنَّ صَلاتَكُم مَعْروضَةٌ عليَّ ﴾** رواه أبو داود

**واتـــای فەرمـــوودەكە** ﴿ بێگومـان لە باشـترینی ڕۆژەكانتـان ڕۆژی هەینیـــیە، زۆر ســـەڵاواتم لەســـەربدەن تێیـــدا، چـــونكە بێگومـــان ســـەڵاواتەكانتان نیشـــانم دەدرێـــت و نمـــایش دەكرێـــت لەسەرم ﴾

## واتای وشەكان

إنَّ : بێگومان

مِنْ : لە

أَفضلِ : باشترینی، شكۆدارترینی

أيَّامِكُم : ڕۆژەكانتان (أيَّام) جەمع و كۆی (يَوْم) ـە واتا ڕۆژ

يَومَ الجُمعةِ : ڕۆژی هەینییە





فأَكْثِروا : جا زۆر بدەن

عليَّ : لەسەرم

الصَّلاةِ : سەڵاوات

فيـــهِ : تيايـــدا، لەڕۆژی هەينـی دا، ئەو هـــائە بـــۆ يَـــوْم الجُمُعـــة دەگەڕێتەوە

فإنَّ : جا بێگومان

صَلاتَكُم : سەڵاواتەكانتان

مَعْروضَةٌ : پيشان دەدرێت، نمايش دەكرێت

عليَّ : لەسەرم

ئەم فەرمـــوودەيە لاوازە لەســـەر ســـەڵەوات دان لەشـــەو و ڕۆژی هەينـی دا هەروەک أبـو حـاتم الـرازي و ابـن عـدي والبيهقـي و خالـد الحايـك و أبـو علي الحـارث الحسـني و سـليمان بـن ناصـر العلـوان و چەنـدين زانـای تـر فەرموويـانە، بەڵكـو سـەڵەوات لەهەمـوو كاتێـک دا كـارێكی چـاكە و خێرێكـی گەورەيە، هەروەک پێغەمـبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمـوويەتی { مَـنْ صَـلَّى عَلَـيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا } رَوَاهُ مُسْلِمٌ [ ٤٠٨ ]



**واتـــای فەرموودەکـــە** ﴿ هەرکەسێک یەك صەڵەواتم لەسەر لێدات ئەوا اللَّهُ تَعَالَى دەصەڵەواتی لەسەر لێ دەدات ﴾

بەڵام ســـەڵەوات دان لە شـــەو و ڕۆژی هەیـــنی دا کـــردەوەی سەلەفی لەسەرە و کارێکی چاکەو ئەنجامی بدەن

قالَ الإِمامُ الشّافِعِيُّ رَحِمَهُ اللَّهُ

( وَأُحِـبُّ كَثـْرَةَ الصَّـلاةِ عَلَى النَّبـيِّ -صلَّى اللهُ علَيـهِ وسَـلَّم- فِي كـلِّ حَـالٍ، وأنَـا فِي يَـومِ الجُمُعـةِ ولَيْلتِهـا أَشَـدُّ اسْـتِحْبَابًا ) كتـاب الأم للشافعي

پێشـەوا شـافیعی فەرمـوویەتی ( حەزدەکەم صـەڵەوات لێبـدەم لەسـەر پێغەمـبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لە هەمـوو کاتێکـدا، وە لە ڕۆژی هەینـی و لەشـەوەکەی دا زۆر زیـاتر حەزم پێیەتـی و پـێم خۆشە صەڵەوات لێ بدەم )





## فەرموودەی یازدەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿خَيْـرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ؛ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا﴾ رواه مسلم

**واتـــای فەرمــــوودەکە** ﴿ باشترین ڕۆژێک کە خۆری بەسەر دا هەڵاتـــووە ڕۆژی هەینییـــە، تیایـــدا ( لەڕۆژی هەینـــی دا ) ئـــادەم دروســـتکراوە، وە تیایـــدا خـــراوەتە بەهەشـــت، وە تیایـــدا لەبەهەشت هێنراوەتە دەرو دەرکراوە ﴾

### واتای وشەکان

خَيْرُ : باشترین

يَوْمٍ : ڕۆژێک

طَلَعَتْ : هەڵاتووە، دەرکەوتووە

عَلَيْهِ : لەسەری دا، ئەم هائە بۆ يَوْم دەگەڕێتەوە

الشَّمْسُ : خۆر







يَوْمُ الْجُمُعَةِ : ڕۆژی هەینییە

فِيهِ : تیایدا، لەڕۆژی هەینی دا

خُلِقَ آدَمُ : دروستکراوە ئادەم علیه السلام

وَفِيهِ : وە تیایدا، وە لەناو رۆژی هەینی دا

أُدْخِلَ : خراوەتە ناو

الْجَنَّةَ : بەهەشت

وَفِيهِ : وە تیایدا ، لە ڕۆژی هەینی دا

أُخْرِجَ : هێنراوەتەدەر، دەرکراوە

مِنْهَا : لە بەهەشت (هَا) بۆ بەهەشت دەگەڕێتەوە





# فەرموودەی شازدەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ ﴾ مُتَّفَقٌ عَليه

**واتای فەرموودەکە** ﴿ کەسی شارەزاو لێهاتوو بە خوێندنەوەی قورئان لەگەڵ مەلائیکەتە بەڕێزو گوێڕایەڵەکانە (لەپلە و گەورەیی دا)، وە ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێتەوە، دەمی تەتەڵە دەکات و دووبارەی دەکاتەوە، وە ئەو کەسە لەسەری قورس و گرانە ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە ﴾

## واتای وشەکان

الْمَاهِرُ : لێهاتوو، شارەزا ، لێزان

بِالْقُرْآنِ : بە قورئان، بەخوێندنەوەی قورئان

مَعَ : لەگەڵ

السَّفَرَةِ : مەلائیکەتەکان، السَّفَرَةِ جەمع و کۆی سافِر یيە





الْكِرَامِ : بەڕێزەکان، الْكِرَامِ جەمع و کۆی کَريم ییە

الْبَرَرَةِ : گوێڕایەڵەکان، الْبَرَرَةِ جەمع و کۆی بارّ ییە

وَالَّذِي : وە ئەو کەسەی

يَقْرَأُ : دەخوێنێتەوە

الْقُرْآنَ : قورئان ، کلام اللّٰه ، قسەی اللّٰه ، پەرتووکی اللّٰه تَعالَی

وَيَتَتَعْتَعُ : تەتەڵە دەکات، پرتە پرتی دەکات، دووبارەی دەکاتەوە

فِيهِ : تێیدا، لە خوێندنەوەی دا

وَهُوَ : وە ئەو کەسە

عَلَيْهِ : لەسەری

شَاقٌّ : زەحمەتە

لَهُ : بۆی هەیە

أَجْرَانِ : دوو پاداشت، دوو ئەجر ( پاداشتی خوێندەوەکە و پاداشتی ئەو زەحمەتی و نارەحەتییەی کە بە چاکی نازانێت بیخوێنێتەوە )[٤]

---

[٤] ئاگاداربن وا تێمەگەن ئەوەی نازانێت قورئان بخوێنێتەوە و لەسەری قورس و گرانە پلە و پایە و پاداشتی زیاترە لەو کەسەی بەجوانترین و شارەزاترین شێوە قورئان دەخوێنێتەوە، بەڵکو ئەوەی شارەزایە بەخوێندەوەی قورئان لە پلەو پایەدا لەگەڵ مەلائیکەتە بەڕێز و گوێڕایەڵەکانە





قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا صُورَةٌ ﴾ مُتَّفَقٌ عَليه

**واتـــای فەرموودەکـــە** ﴿ مەلائیکەتەکان ناچنە ناو ماڵێکەوە سەگێك یان وێنەیەکی تێدابێت ﴾

## واتای وشەکان

لا تَدْخُلُ : ناچنە ناو

الْمَلَائِكَةُ : مەلائیکەتەکان، الْمَلَائِكَة جەمع و کۆی مَلَك ییە

بَيْتًا : ماڵێک

فِيهِ : تێیدابێت ئەو ماڵە، ئەو هائە بۆ بَیْت دەگەڕێتەوە

كَلْب : سەگ

صُورَة : وێنە







## ✍دوو ڕوونکردنەوە

١– مەلائیکەتـی ڕەحـمەت و خێـر و خۆشـی نـاچن بـۆ هەمـوو شـوێنێک ، بەڵام ئەو مەلائیکەتـانەی کـردەوەی بەشـەرەکان دەنوسن دەچنە هەموو شوێن و جێگایەك

٢– وێـنەی ڕوح لەبەر دروسـت نییـە بەمـاڵەوە هەڵی واسـیت جـا مـرۆڤ بێـت یـان باڵنـدە بێـت یـان ئاژەڵەکـانی تـر،، بەڵام چیـا، ڕوبار، گوڵ، مزگەوت.... دروستن









قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ﴾ رواهُ مُسْلِم

**واتای فەرموودەکە** ﴿ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان، بێگومان شەیتان ڕادەکات لەو ماڵەی کە سورەتی بەقەرەی تێدا دەخوێندرێتەوە﴾

## واتای وشەکان

لَا تَجْعَلُوا : مەیگێڕن ، مەیکەن

بُيُوتَكُمْ : ماڵەکانتان، بُيُوت جەمع و کۆی بَيْت ییە

مَقَابِرَ : گۆڕستانەکان، مَقَابِر جەمع و کۆی مَقْبَرَة یە، مَقْبَرَة بەسێ شێوە دەخوێندرێتەوە مَقْبَرَة، مَقْبُرَة، مَقْبِرَة

إِنَّ الشَّيْطَانَ : بێگومان شەیتان

يَنْفِرُ : ڕا ئەکات ، هەڵدێت

مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي : لەو ماڵەی

تُقْرَأُ : دەخوێندرێ

فِيهِ : تێیدا (لەو ماڵەی) دا

سُورَةُ الْبَقَرَةِ : سورەتی بەقەرە







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ ﴾ مُتَّفَقٌ عَليه

**واتــــای فەرموودەکـــــە** ﴿ مـرۆڤ لـە قیـامەت دا لەگەڵ ئەو کەســە کــۆدەکرێتەوە و حەشــر دەکرێــت کــە لــە دونیــادا خۆشــی ویستووە ﴾

## واتای وشەکان

الْمَرْء : مرۆڤ

مَعَ : لەگەڵ

مَنْ : ئەو کەسەیە ( لە قیامەت ) دا

أَحَبَّ : خۆشی ویستووە

🖂 جـا بـۆیە ئاگـاداربن و بـزانن کێتـان خــۆش دەوێـت ئەگەر جـولەکەو گـاوڕ و عەلمـانی و طاغوتەکانتـان خــۆش دەوێــن ئەوە موژدەتـان لـێ بێـت لەگەڵ وان دا بـــۆ دۆزەخ دەنێـــردرێن، اللَّهُ تَعَـــالَی لەخۆشەویســـتی ئەو کافرانە بمان پارێزێت





# فەرموودەی بیستەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ يَا غُلَامُ، سَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ ﴾ مُتَّفَقٌ عَليه

**واتــــای فەرمــــوودەکە** ﴿ ئەی منـاڵ نـاوی اللَّهُ تَعَـالَى بهێـنه، وه بەدەستی ڕاستت بخۆ، وه لەپێشە خۆتەوە بخۆ ﴾

## واتای وشەکان

**يَا** : ئەی

**غُلَامُ** : منال ( ناوە بۆ منالێکی لەدایک بوو تا باڵغ دەبێت)

**سَمِّ اللَّهَ** : بِسْمِ اللَّه بکە، ناوی اللَّهُ تَعَالَى بهێنە

**كُلْ** : بخۆ

**بِيَمِينِكَ** : ، بەڕاستەت ، بەدەستی ڕاستت

**وَكُلْ** : وه بخۆ

**مِمَّا** : لەوەی

**يَلِيكَ** = لەلای خۆتە، لە پێش خۆتە







## ✍ سێ ڕوون کردنەوە

١ ــــ نەووی دەڵێــــت بە کـــۆدەنگی هەمــــوو زانایــــان بِسْــــمِ اللَّهِ کـــردن لەپــێش نــان خـــواردن ســـوننەتە، بەڵام وانیـــیە بەڵکـــو کۆمەڵێــک لەزانایــان دەفەرمــوون واجــبە، وە پێشــەوا شــافیعی لە کتابی ( الأُمّ و الرسالة ) دا دەفەرموێت واجبە بِسْمِ اللَّه بکرێت

٢ ــــ واجــبە بەدەســتی ڕاســتت بخــۆی چــونکە پێغەمــبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْـــــهِ وَسَـــــلَّمَ فەرمـــــانی کـــــردووە لەم فەرمـــــوودەیە و لەفەرمــوودەیەکی تــری صــەحیح دا ( أَنَّ رَجُــلًا أَكَــلَ عِنْــدَ رَسُــولِ اللَّهِ صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ بِشِــمَالِهِ، فَقَــالَ : كُــلْ بِيَمِينِــكَ، قَــالَ : لَا أَسْــتَطِيعُ. قَــالَ : لَا اسْــتَطَعْتَ، مَــا مَنَعَــهُ إِلَّا الْكِبْــرُ ) رواهُ مُسْــلِمٌ،،، وە پێغەمــبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ قەدەغەی کــردووە بەدەســتی چەپ بخـــۆین چـــونکە شـــەیتان بەدەســـتی چەپـــی دەخـــوات، هەروەك فەرمــوویەتی ( لَا تَــأْكُلُوا بِالشِّــمَالِ، فَــإِنَّ الشَّــيْطَانَ يَأْكُــلُ بِالشِّمَالِ ) رواهُ مُسْلِمٌ

٣ ــــ پێغەمـــبەر صَـــلَّى اللَّهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ فەرمـــانی کـــردووە کە لەپێشـــەوەی خـــۆت بخـــۆی بـــۆیە پێشـــەوا شـــافیعی دەفەرموێـــت ئەگەر کەســێک لەپێشــەوەی خــۆی نەیخــوارد وە ئاگــاداریش بێــت کە پێغەمــبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ باســی کــردووە ئەوە ســەرپێچی کــردووەو تاوانبــارە ( وتعقبــه تــاج الــدين الســبكي في شــرحه بــأن الشــافعي نــص في غيــر موضــع على أن مــن أكــل ممــا لا يليــه عالمــا بالنهي كان عاصيا آثما ) فتح الباري لابن حجر





## فەرموودەی بیست و یەکەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ الِاسْتِئْذَانُ ثَلَاثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ وَإِلَّا فَارْجِعْ ﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيه

**واتـــای فەرمـــوودەکە** ﴿ داوای مۆڵەت کردن و ئیزن وەرگرتن سێ جارە، ئەگەر ئیزندرایت، وە ئەگەر نا بگەڕێوە ﴾

**واتـــا**: مۆڵەت وەرگرتن بۆ لەدەرگادان سێ جارە ئەگەر مۆڵەتیان دایت بچیتە ژوورەوە ئەوە باشە ئەگەرنا بگەڕێوە

### واتای وشەکان

الِاسْتِئْذَانُ : داوای مۆڵەتکردن، داوای ئیزن وەرگرتن

ثَلَاثٌ : سێ جارە

فَإِنْ : جا ئەگەر

أُذِنَ لَكَ : ئیزندرا بۆت، مۆڵەتدرا بۆت، ئیزندرایت

وَإِلَّا : وە ئەگەر نا

ارْجِعْ : بگەڕێوە









قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**«يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»** مُتَّفَقٌ عليه

**واتای فەرموودەکە** ﴿ کەسی سواری(ئە وەی سواری شتێك بووە جا وشترێت، ئەسپ بێت، گوێدرێژ بێت ،، سەیارە بێت...) سەلام دەکات لەو کەسەی بەپێیان دەڕوات،،، وە ئەو کەسەی بەپێیان دەڕوات سەلام دەکات لەو کەسەی دانیشتووە،، وە ئەو کەسانەی کەمن (بۆ نموونە ٢ کەس یان ٣ کەسن) سەلام دەکەن لەکەسانی زۆرتر لەخۆیان ﴾

## واتای وشەکان

يُسَلِّمُ = سەلام دەکات

الرّاكِبُ = سواری، سوارچاك،

عَلَى = لەسەر

الماشِي = پیادە، ئەو کەسەی بەپێیان دەڕوات





والماشـي علـى القاعِـد = وه ئەو كەســەی بەپێیــان دەڕوات ســەلام دەكات لە كەسی دانیشتوو

القاعِد = دانیشتوو

والقَليلُ عَلَى الْكَثِيرِ = خەڵكی كەم سەلام لەخەڵكی زۆر دەكات

القَليل = كەم

الْكَثِير = زۆر





# فەرموودەی بیست وسێیەم

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا شَيْئًا فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ ﴾ رواه الترمذي، حديث صحيح

**واتای فەرموودەکە** ﴿ اللَّه تَعالَى ڕووی کەسێک ڕۆشن وجوان بکات، لە ئێمەی بیست شتێک (فەرموودەیێک) جا شتەکە (فەرموودەکە)ی بگەیەنێت وەکوو ئەوەی بیستویەتی، جا زۆرجار ئەو کەسەی شتەکەی پێی گەیەنراوە شارەزاترە و باشتر تێدەگات لەو کەسەی گوێی لێبووە و دەیگەیەنێت ﴾

## واتای وشەکان

نَضَّرَ : گەشاوە ، جوان بوو

نَضَّرَ اللَّهُ : ئەمە دوعایە واتا اللَّه تَعالَى جوان و گەشاوەو درەوشاوەی بکات

امْرَأً : کەسێک ( ڕووی کەسێک )





سَمِعَ : بیستی

مِنَّا : لە ئێمە

شَيْئًا : شتێک (فەرموودەیەک)

فَبَلَّغَهُ : جا ئەو شتەی گەیاندووە، هەواڵی داوە بەم شتە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ شَيْئًا

كَمَا : وەکوو ئەوەی

سَمِعَ : بیستویەتی (وەک خۆی بێ زیاد و کەم)

فَرُبَّ مُبَلَّغٍ : جا زۆر هەواڵ پێدراو ، زۆر پێگەیەنراو

رُبَّ : حەرفی جەڕە بۆ کەمییەتی و زۆرییەتی بەکار دێت ، رُبَّ شازدە لوغە و خوێندنەوەی تێدایە وەکوو ابن هشام وای وتووە لە کتابی موغنی، رُبَّ، رَبَّ، رُبَ، رَبَ، رُبَّةَ .....

مُبَلَّغٍ : ئاگادارکراو، هەواڵ پێدراو، پێگەیەنراو، ئەو کەسەی شتەکەی پێ ئەگات

أَوْعَى : شارەزاترە، زیرەکترە، باشتر تێدەگات

مِنْ سَامِعٍ : لە بیسەر، لەو کەسەی بیستویەتی







عَـنْ عَبْـدِ اللَّهِ بْـنِ مَسْـعُودٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ قَـالَ ﴿ سَـأَلْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: أَيُّ الْعَمَـلِ أَحَـبُّ إِلَـى اللَّهِ؟ قَـالَ: الصَّلَاةُ عَلَـى وَقْتِهَـا " قَـالَ: ثُـمَّ أَيٌّ؟ قَـالَ: ثُـمَّ بِـرُّ الْوَالِـدَيْنِ " قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ مُتَّفَقٌ عَليه

**واتـــای فەرمـــوودەکە** ﴿ لە عبـداللە ی کـوڕی مسـعودەوە رضـي اللە عــنە فەرمــوویەتی: پرســیارم لە پێغەمــبەر کــرد صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـــلَّمَ، چ کـــردەوەیەک خۆشەویســـترینە لە لای اللە؟ فەرمـــووی: نــوێژ لە کــاتی خۆیــدا، وتــی: ئەی پاشــان چــی؟ فەرمــووی: چــاکەکە کــردن لەگەڵ دایــک و بــاوک، وتــی: ئەی پاشــان چــی؟ فەرمـــووی: جیهاد و تێکۆشان لە پێناو اللە تعالی ﴾

## واتای وشەکان

سَأَلْتُ : پرسیارم کرد

أَيُّ الْعَمَلِ : چ کردەوەیەک، کام کردەوە





أَحَبُّ : خۆشەویستترینە

إِلَى اللَّهِ :لە لای اللە تعالی

الصَّلَاةُ : نوێژ

عَلَى وَقْتِهَا : لە کاتی خۆیدا (ها) دەگەڕێتەوە بۆ (الصلاة)

بِرُّ الْوَالِدَيْنِ : چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک

الْجِهَادُ : تێکۆشان

فِي سَبِيلِ اللَّهِ : لە پێناو اللە تعالی







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ حُـرِّمَ لِبَـاسُ الْحَرِيـرِ، وَالـذَّهَبِ عَلَى ذُكُـورِأُمَّتـِي، وَأُحِـلَّ لِإِنَاثِهِمْ ﴾ رواه الترمذي

**واتـــای فەرمـــوودەکە** ﴿ حەڕامکـراوە لەبەرکردنـی پۆشـاکی ئاوریشـــم، وە حەڕامکـــراوە زێـــڕ لەســـەر پیـــاوان و نێرینەکـــانی ئـوممەتەکەم، وە حەڵاڵکـراوە( ئاوریشـم و زێـڕ ) لەسـەر ئافرەتـان و مێیینەکانی ئوممەتەکەم ﴾

## واتای وشەکان

حُرِّمَ : حەڕامکراوە، قەدەغەکراوە

لِبَاسُ : جل و بەرگ ، پۆشاک

الْحَرِيرِ : ئاوریشم

وَالذَّهَبِ : وە زێڕ و ئاڵتون

عَلَى : لەسەر



ذُكُورِ : نێرینەکانی، پیاوانی، بچووک و گەورە دەگرێتەوە

أُمَّتِي : ئوممەتەکەم

وَأُحِــلَّ : حەڵاڵکــراوە، ڕێپێــدراوە( بەخــۆوە کردنــی زێــڕ و لەبەر کردنی جلی حەریر و ئاوریشم )

لِإِنَــاثِهِمْ : بــۆ مێیینەکانیــان، بــۆ ئافرەتانیــان، بــۆ مێیینەکــانی ئومەتم، وشەی هِمْ دەگەڕێتەوە بۆ أُمَّتِي







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ إِنَّ مِن خيارِكُم أَحْسَنَكُم أَخْلاقًا ﴾ مُتَّفَقٌ عَليه

**واتـــــای فەرمـــــــوودەکە** ﴿ بێگومــان لە باشــترینەکانتان چاکترینتانە لە ڕەوشت و ئادابەکان دا ﴾

## واتای وشەکان

إِنَّ : بێگومان، بەڕاستی

مِن : لە

خيارِكُم : باشترینەکانتان، خيارِ جەمع و کۆی خَيْر ییە

أَحْسَنَكُم : چاکترین و باشترینتانە

أَخْلاقًا : لە ڕەوشت و ئادابەکان، أَخْلاق جەمع و کۆی خُلُق ییە









قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ، وَأَوَّلُ شَافِعٍ، وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ﴾ رواه مسلم

**واتای فەرموودەکە** ﴿من گەورەی نەوەی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەت، وە یەکەم کەسم قەبری لەسەر شەق دەبێت و زیندوو دەکرێمەوە، وە یەکەم شەفاعەتکارم وە یەکەم شەفاعەت وەرگیراوم﴾

## واتای وشەکان

أنا : من

سَيِّدُ : گەورە ، گەورەی قەومێک

وَلَدِ : کوڕ، نەوە

آدَمَ : پێغەمبەر ئادەم علیه السلام

يومَ القِيامَةِ : لە ڕۆژی قیامەت







وأَوَّلُ مَن : وە یەکەم کەسێک

يَنْشَقُّ : شەق دەکرێ، لەت دەکرێ

عَنْهُ : بۆی، هائەکە بۆ مَنْ دەگەڕێتەوە

القَبْرُ : قەبر، گۆڕ

وأَوَّلُ : وە یەکەم

شافِعٍ : شەفاعەتکار، تکاکار

وأَوَّلُ : وە یەکەم

مُشَفَّعٍ : شەفاعەت قەبووڵکراو، تکا وەرگیراو





## فەرموودەی بیست وهەشتەم

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

«لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ» مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە** ﴿ بڕوا ناهێنێت هیچ یەکێک لە ئێوە تاوەکوو خۆشەویستر دەبم لەلای لە دایك و باوکی و لە کوڕو کچی و لەهەموو خەڵکی بە گشتی ﴾

### واتای وشەکان

لَا يُؤْمِنُ : بڕوا ناهێنێت

أَحَدُكُمْ : یەکێك لەئێوە

حَتَّى : هەتا، تاوەکوو

أَكُونَ : ئەبم

أَحَبَّ : خۆشەویستر

إِلَيْهِ : لەلای، ئەو هائە بۆ أَحَدُكُمْ دەگەڕێتەوە





مِنْ : له

وَالِـدِهِ : بـاوکی (مەبەسـت دایـك و بـاوکە) هـائەکە دەگەڕێـتەوە بـۆ أَحَدُکُمْ

وَوَلَــدِهِ : وە کــوڕی (مەبەســت کــوڕو کچــە) هــائەکە دەگەڕێــتەوە بۆ أَحَدُکُمْ

وَالنَّاسِ : خەڵکی

أَجْمَعِينَ : بەگشتی ، هەمووی

دەبێـت پێغەمـبەرت صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لە هەمـوو کەسـێک خۆشتر بووێت







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**«مَـنْ رَآنِي فِي الْمَنَـامِ فَقَـدْ رَآنِي؛ فَـإِنَّ الشَّـيْطَانَ لا يَتَمَثَّـلُ بِي»** مُتَّفَقٌ عَليه

**واتــــای فەرمـــــوودەکە** ﴿ هەر کەسێک منی بینی لەخەودا، ئەوە بێگومــان منــی بینیــوە، بێگومــان شــەیتان ناتوانێــت خــۆی بێنێتە سەر شێوەو وێنەی من ﴾

## واتای وشەکان

مَنْ : هەرکەسێک

رَآنِي : منی بینی

فِي : لە

الْمَنَامِ : خەودا، لەکاتی خەودا

فَقَدْ : ئەوە بێگومان

رَآنِي : منی بینیوە( لەسەر شێوەی ڕاستی )

إِنَّ : بێگومان

الشَّيْطَانَ : شەیتان

لا يَتَمَثَّلُ بِي : ناشوبهێ بەمن ، ناتوانێ بێتە سەر شێوەی من

بِي : بەمن









قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ إِلَّا مَن أَبَى، قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَن يَأْبَى؟ قالَ: مَن أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَن عَصَانى فقَدْ أَبَى**

رواه البخاري

**واتـــای فەرمـــــوودەکە** ﴿ هەمـوو ئـوممەتەکەم دەچـنە بەهەشـــتەوە مەگەر کەســێک نەیەوێــت، وتیــان: ئەی نێــردراوی اللَّه تَعــالَى کــێ نایەوێــت بچێــتە بەهەشــتەوە؟ فەرمــووی: هەر کەســێک گــوێڕایەڵیم بکـــات و شــــوێنم بکەوێــت دەچێـــتە بەهەشـــــتەوە، وە هەر کەســــێک ســــەرپێچیم بکـــات ئەوە نەیویستووە (بچێتە بەهەشتەوە) ﴾

## واتای وشەکان

كُلُّ : هەموو

أُمَّتِي : ئوممەتەکەم

يَدْخُلُونَ : دەچنە ناو







الجَنَّةَ : بەهەشت

إِلَّا : جگە، بێجگە، مەگەر

مَن : کەسێک

أَبَى : نەیویست، پشتی هەڵکرد

قالوا : وتیان

يا رَسُولَ اللَّهِ : ئەی نێردراوی الله

مَن : کێ

يَأْبَى : نایەوێت ، پشت هەڵدەکات

قالَ : فەرموو

مَن : هەر کەسێک

أَطَاعَنِي : گوێڕایەڵی کردم ، شوێنم کەوت

وَمَن : وە هەر کەسێک

عَصَانِي : سەرپێچی کردم

فقَدْ : ئەوە بێگومان

أَبَـــى : نەیویســـــتووە، پشـــتی هەڵکـــــردووە( لەوەی بچێـــــتە بەهەشتەوە )







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

«لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا مِنْ أُمَّتِي خَلِيلًا لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ، وَلَكِنْ أَخِي وَصَاحِبِي» مُتَّفَقٌ عَليه

**واتـــــای فەرمـــــــــوودەکە** ﴿ئەگەر هەڵمبژاردبــوایە لە ئـــوممەتەکەم دۆســـتێکی زۆر خۆشەویســـت – کە لە کارەکـــان دا پشـــتی پـــێ ببەســـترابوایە – ئەوە ئەبـــوو بەکـــری صـــدیقم هەڵـدەبژارد، بەڵام ئەبـوو بەکـری صـدیق بـرامە لە دیـن ودۆسـت و هاوەڵمە﴾

﴿ئەو دۆســـتە خۆشەویســـتەی کە پێغەمـــبەر صَـــلَّى اللَّهُ عَلَيْــهِ وَسَـــلَّمَ هەڵیبـژاردووە ئەمە تەنهـــا اللە یە، گەر نـــا ئەبـــوو بەکـــری صدیقی هەڵدەبژارد﴾





## واتای وشەکان

لَوْ : ئەگەر

كُنْتُ مُتَّخِذًا : هەڵمبژاردبوایە

مُتَّخِذًا : اسم فاعيلە، لە إِتَّخَذَ ، إِتَّخَذَ واتا هەڵیبژارد، وە تەعەددا دەکات بۆلای دوو مەفعولان یەکیان بەهۆی حەرفی جەڕەوە دەبێت

مِنْ : لە

أُمَّتِي : ئوممەتەکەم

خَلِيلًا : دۆستێکی دڵسۆز، دۆستێکی خۆشەویست ، خَلِيل ئەو دۆستە خۆشەویستەیە کە پێویستیت پێی دەبێت و پشتی پێ دەبەستی لەکارەکان دا

لَاتَّخَذْتُ : بێگومان هەڵمدەبژارد

أَبَا بَكْرٍ : ئەبوو بەکری صدیق

لَكِنْ : بەڵام ( ئەبوو بەکری صدیق )

أَخِي : برامە ( لە دین )

وَصَاحِبِي : هاوەڵمە ( لەخۆشی و ناخۆشی و لەسەفەر و نیشتەجێ دا )







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ، وَأَشَدُّهُمْ فِي أَمْرِ اللَّهِ عُمَرُ، وَأَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ، وَأَعْلَمُهُمْ بِالْحَلَالِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَ أَفْرَضُهُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَ أَقْرَؤُهُمْ أُبَيٌّ، وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينٌ، وَأَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ﴾ رواه الترمذي و غيره

**واتـــای فەرمـــوودەكە** به ڕەحمترینی ئوممەتەكەم بە ئوممەتەكەم ئەبوو بەكری صدیقە، بەهێزترینیان لە دینی اللّٰه تعالَی عومەری كوڕی خەتابە، شەرمنترینیان عوثمانی كوڕی عەفانە، زاناترینیان بە حەلال و حەڕام موعاذی كوڕی جەبەلە، زاناترینیان بەعلم و زانستی میرات زەیدی كوڕی ثابیتە، زاناترینیان بە خوێندنەوەی قورئان ئوبەی كوڕی كەعبە، وە بۆ هەموو ئوممەتێك ئەمین و دەست پاكێك هەیە، وە ئەمین و دەست پاكی ئەو ئوممەتە ئەبوو عوبەیدەی كوڕی جەڕاحە





## واتای وشەکان

أَرْحَمُ : بەڕەحمترین، میهرەبانترینی

أُمَّتِي : ئوممەتەکەم

بِأُمَّتِي : بە ئوممەتەکەم

أَبُو بَكْرٍ : ئەبوو بەکری صدیقە( ناوی خۆی عبداللّەیە )

وَأَشَــــدُّهُمْ : وەتونـــــدترینیان، بەهێزترینیــــان، بەهێزترینــــی ئوممەتەکەم، هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ أُمَّتِي

فِى أَمْرِ اللَّهِ : لەفەرمانی اللَّه ، لەدینی اللَّه

عُمَرُ .: عومەری کوڕی خەتابە

وَأَصْــدَقُهُمْ : وە ڕاســتگۆترینیان، ڕاســتگۆترینی ئــوممەتەکەم، هُــمْ دەگەڕێتەوە بۆ أُمَّتِي

حَيَاءً : لەشەرم و حەیادا

عُثْمَانُ : عوثمانی کوڕی عەفانە

وَأَعْلَمُهُــــمْ : وە زاناترینیـــان، زانـــاترینی ئـــوممەتەکەم، هُـــمْ دەگەڕێتەوە بۆ أُمَّتِي

بِالْحَلَالِ : بەحەلال

وَالْحَرَامِ : وە بەحەڕام





مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ : موعاذی کوڕی جەبەلە

وَأَفْرَضُــهُمْ : وە میـرات زانترینیــان، وە زاناترینیــان بە علــم و زانســتی میرات، هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ أُمَّتِي

زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ : زەیدی کوڕی ثابیتە

وَأَقْــرَؤُهُمْ : وەخوێنەوارترینیــان، وە زاناترینیــان بە خوێنــدنەوەی قورئان، هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ أُمَّتِي

أُبَيٌّ : ئوبەی کوڕی کەعبە

وَلِكُلِّ أُمَّةٍ : بۆ هەموو ئوممەتێک

أَمِينٌ : ئەمینێک، دەستپاکێک ( هەیە )

وَأَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ : وە ئەمین و دەستپاکی ئەو ئوممەتە

أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ : ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە

ئەم فەرمــوودەیە ضــەعیف و لاوازە، جــگە لە بــڕگەی کۆتــایی فەرموودەکە نەبێت

لەسەر ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح



وَقــالَ التِّرْمِـذِيُّ رَحِمَـهُ اللَّهُ { هَــذَا حَــدِيثٌ حَسَــنٌ غَرِيــبٌ، لَا نَعْرِفُـهُ مِـنْ حَــدِيثِ قَتَـادَةَ إِلَّا مِـنْ هَـذَا الْوَجْـهِ، وَقَـدْ رَوَاهُ أَبُــو قِلَابَــةَ، عَــنْ أَنَــسٍ، عَــنِ النَّبِــيِّ صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ نَحْــوَهُ، وَالْمَشْــهُورُ حَــدِيثُ أَبِي قِلَابَةَ }

قَـالَ المُحَـدِّثُ عَبْـدُ اللَّهُ السَّـعْدُ { هَـذَا الحَـديثُ لا شَـكَّ أَنَّـهُ حَـدِيثٌ مَعْلُولٌ لَا يَصِحُّ }

واتــاكەی { ئەم فەرمـوودەیە گومـانی تێـدا نـیە مەعلـولە و صـەحیح نیە }

قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ { لِكُـلِّ أُمَّـةٍ أَمِـينٌ، وَأَمِـينُ هَـذِهِ الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ } مُتَّفَقٌ عَليه

واتـــاکەی { بـــۆ هەمـــوو ئوممەتێـــک ئەمینێـــک هەیە، وە ئەمـــین و دەستپاکی ئەو ئوممەتە ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحە }





## فەرموودەی سی وسێیەم

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ مَـنْ صَـامَ رَمَضَـانَ إِيمَانًـا وَاحْتِسَـابًا غُـفِـرَلَـهُ مَـا تَقَـدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتـــای فەرمــــوودەکە** ﴿ هەرکەسێک ڕۆژووی مـانگی ڕەمەزانی گـــرت بە ئیمـــانەوە وە بـــە داواکـــردن و چـــاوەڕوانی ئەجـــر و پاداشـــتەوە لە اللَّە تَعــالَى، ئەوە لەو گونــاح و تاوانــانەی دەبـــووردرێ کە پێشە خۆی خستووە ﴾

## واتای وشەکان

مَنْ : هەرکەسێک

صَامَ : بە ڕۆژووبوو، ڕۆژووی گرت

رَمَضَانَ : لە مانگی ڕەمەزان

إِيمَانًـــا : بە ئیمـــانەوە، بە بەڕاســـت دانـــانەوە( بەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرزە )



وَاحْتِسَـــــابًا : وه به‌داواكردنـــــى پاداشــــــت له اللّٰه‌یه‌وه، وه به چاوه‌ڕوانى پاداشته‌وه بوو له اللَّه تَعالَى

غُفِرَ : بوردراوه

لَهُ : بۆى ، ئه‌و هائه بۆ مَنْ ده‌گه‌ڕێته‌وه

مَا : ئه‌وه‌ى

تَقَدَّمَ : پێشى خستووه

مِنْ : له

ذَنْبِهِ : گوناه و تاوانى







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿سَــبَقَ الْمُفَــرِّدُونَ " قَــالُوا: وَمَــا الْمُفَــرِّدُونَ يَــا رَسُــولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ﴾ رواه مسلم

**واتـــای فەرمـــوودەکە** ﴿ پێش کەوتن گۆشەگیرەکان، هاوەڵان وتیان گۆشەگیران چێنە ئەی نێردراوی اللَّه تَعالَی، فەرمووی ئەو پیاو و ئافرەتانەن زیکر و یادی اللَّه زۆر دەکەن ﴾

**واتای وشەکان**

سَبَقَ : پێشکەوت

الْمُفَــرِّدُونَ : گۆشەگیرەکان، تاکرەوەکان( ئەوانەی وازیان لەخەڵکی هێناوە لەبەر زیکرو عیبادەت )

قَالُوا : وتیان ( صەحابەکان )

وَمَا الْمُفَرِّدُونَ : گۆشەگیر و تاکرەوەکان چێنە

يَا رَسُولَ اللَّهِ : ئەی نێردراوی اللَّه تَعالَی



قَالَ : فەرمووی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا : ئەو پیاوانەی زیکر و یادی اللَّه زۆر دەکەن

كَثِيرًا : زۆر

وَالـــذَّاكِرَاتُ : ئەو ئافرەتـــانەی زیکـــرو یـــادی اللَّه زۆر دەکەن، خـــۆی تەقـــدیرەکەی وَالـــذَّاكِرَاتُهُ وە، ئەو هـــائەی وَالـــذَّاكِرَاتُهُ دەگەڕێـــتەوە بـــۆ اللَّه، بەڵام هـــائەکە حەذفکـــراوە و ڕەش کراوەتەوە







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿لَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَدَابَرُوا ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ﴾ مُتَّفَقٌ عَليه

**واتای فەرموودەکە** ﴿ ڕقتان لەیەرکتری نەبێتەوە، وە حەسوودی بەیەکتری مەبەن، وە پشت لەیەکتری مەکەن، وە ببنە بەندەی اللَّه تَعالَى و برای یەکتری، وە حەلال نیە بۆ مسوڵمان هەجری براکەی بکات زیاتر لە سێ ڕۆژان ﴾

**واتای وشەکان**

لَا تَبَاغَضُوا : ڕقتان لەیەکتری نەبێتەوە

وَلَا تَحَاسَدُوا : حەسوودی بەیەک مەبەن

وَلَا تَدَابَرُوا : هەجری یەکتری مەکەن، پشت لەیەکتری مەکەن

وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا : ببنە بەندەی اللَّه و برای یەکتری



عِبَادَ اللَّهِ : بەندەکانی اللَّه، عِبَاد جەمع و کۆی عَبْد ییە، عَبْد واتا بەندە.[٥]

إِخْوَانًا : إِخْوَان جەمع و کۆی أَخ ییە، أَخ واتا برا ، لێرە مەبەستی برای دینییە

وَلَا يَحِلُّ : حەلال نیە

لِمُسْلِمٍ : بۆ مسوڵمانێک

أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ : برای مسوڵمانی هەجر بکات ، پشت لەبرای مسوڵمانی بکات

أَخَاهُ : براکەی، برا مسوڵمانەکەی، هائە کە دەگەڕێتەوە بۆ مُسْلِم

فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ : سەرووی سێ ڕۆژان

أَيَّامٍ : أَيَّامٍ جەمع و کۆی يَوْم ییە واتا ڕۆژ

---

[٥] عَبْد زیاد لە ٢٠ جەمع و کۆی هەیە، ئەمەش هەندێک لە جەمع و کۆیەکانییەتی ١- عَبْدُون، ٢– عَبِيدٌ، ٣– أَعْبُدٌ، ٤– عِبادٌ، ٥– عُبْدانٌ، ٦– عِبْدانٌ، ٧– عِبِدَّانٌ، ٨– مَعْبَدَةٌ، ٩– مَعَابِد ١٠– عِبِدَّاء، ١١– عِبِدَّا، ١٢– عُبُدٌ، ١٣– عَبُدٌ، ١٤– مَعْبُداء، ١٥– عَبِيدُون





قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ؛ فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّيَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا. وَ إِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ؛ فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَيَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا﴾ مُتَّفَقٌ عليه

**واتای فەرموودەکە** ﴿پەیوەستبن بە ڕاستگۆییەوە، بێگومان ڕاستگۆیی ڕێنمایی کەرە بۆ کردەوەی چاک، وە کردەوەی چاک ڕێنمایی کەرە بۆ چوونە بەهەشت، وە بەردەوام پیاو هەیە ڕاست دەڵێت و سوورە لەسەر ڕاستگۆیی تا ئەوکاتەی دەنوسرێت لەلای اللَّه بە زۆر ڕاستگۆیەکە، وە خۆتان بپارێزن لە درۆ کردن، بێگومان درۆکردن ڕێنمایی کەرە بەرەو کردەوە خراپەکان، وەکردەوە خراپەکان ڕێنمایی کەرە بۆ چوونە ناو ئاگر، وە پیاو هەیە بەردەوام درۆ دەکات و سوورە لەسەر درۆ کردن تا ئەوکاتەی دەنوسرێت لەلای اللَّه تَعالَی بە زۆر درۆزنەکە﴾





## واتای وشەکان

عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ : پەیوەستبن بە ڕاستگۆییەوە، مولزەمبن بەڕاستگۆیی

فَإِنَّ الصِّدْقَ : چونکە بێگومان ڕاستگۆیی

يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ : ڕێنمایی کەرە بۆ کردەوەی چاک، بەرەو کردەوەی چاکت دەبات

وَإِنَّ الْبِرَّ : وە بێگومان کردەوەی چاک، البِرّ ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو خەیر و چاکەیەک

يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ : ڕێنمایی کەرە بۆ بەهەشت ، دەتبات بەرەو بەهەشت

وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ : وە بەردەوام پیاو

يَصْدُقُ : ڕاست دەڵێت

وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ : وە سوورە لەسەر ڕاستگۆیی، ئارەزووی ڕاستگۆیی دەکات

حَتَّى يُكْتَبَ : تا ئەوکاتەی دەنووسرێت، تا ئەو کاتەی بڕیاری لەسەر دەدرێت

عِنْدَ اللَّهِ : لەلای اللَّه تَعالَى

صِدِّيقًا : بە زۆر ڕاستگۆیی، صِدِّيق لەسەر وەزنی فِعِّيل یـیە بۆ موبالەغەو زیادە ڕەوییە ( بۆیەش دەوترا ئەبوو بەکری صِدِّيق چونکە زۆۆر ڕاستگۆ بوو )

وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ : خۆتان بپارێزن لەدرۆ، وریابن لە درۆکردن

فَإِنَّ الْكَذِبَ : چونکە بێگومان درۆ کردن

يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ : ڕێنمایی دەکات بۆ کردەوە خراپەکان، دەتبات بەرەو کردەوە خراپەکان

وَإِنَّ الْفُجُورَ : وەبێگومان کردەوە خراپەکان، الْفُجُور ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو شەڕ و خراپەیەک

يَهْدِي إِلَى النَّارِ : ڕێمایی کەرە بۆ ئاگر، بەرەو ئاگرت دەبات ( بۆ ناو ئاگری دۆزەخ )

وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ : بەردەوام پیاو

يَكْذِبُ : درۆ دەکات

وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ : وە سوورە لەسەر درۆکردن، ئارەزووی درۆ دەکات

حَتَّى يُكْتَبَ : تاوەکوو دەنوسرێت، تاوەکوو بڕیاری لەسەر دەدرێت

عِنْدَ اللَّهِ : لەلای اللّٰه تَعالَی

كَذَّابًا : بە زۆر درۆزن، کَذَّاب لەسەر وەزنی فَعَّال یە بۆ موبالەغەو زیادە ڕەویە ( سبحان اللّٰه گەر لەلای خەڵکی بەدرۆزن ناسراو بی هەندە ناخۆش بێت، ئەی ئەگەر لەلای اللّٰه تَعالَی ناوت بە درۆزن نوسرابێت دەبێت چەندە ناخۆش بێت )







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ ﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْه

**واتای فەرموودەکە** ﴿ هەرکەسێک بڕوای بە اللَّه تَعالَى و بەڕۆژی دوایی هەیە با ئەزیەتی جیرانەکەی نەدات، وە هەرکەسێک بڕوای بە اللَّه تَعالَى و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز بگرێت لە میوانەکەی، وە هەر کەسێک بڕوای بە اللَّه تَعالَى و ڕۆژی دوایی هەیە با خێر و چاکە بڵێت یان بێدەنگ بێت و قسە نەکات ﴾

## واتای وشەکان

فَلَا يُؤْذِ جَارَهُ : با ئەزیەتی جیرانەکەی نەدات

فَلَا يُؤْذِ : با ئەزیەت نەدات







جَارَهُ : دراوسێکەی، جیرانەکەی

فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ : با ڕێزبگرێت لە میوانەکەی

فَلْيُكْرِمْ : با ڕێز بگرێت

ضَيْفَهُ : میوانەکەی

فَلْيَقُلْ خَيْرًا : با خێر و چاکە بڵێت

فَلْيَقُلْ : با بڵێت

خَيْرًا : چاکەیەک، خێرێک ، وتەیەکی چاک

أَوْ : یان

لِيَصْمُتْ : بێدەنگ بێت







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿إِنَّ أَحَـدَكُمْ إِذَا مَـاتَ عُـرِضَ عَلَيْـهِ مَقْعَـدُهُ بِالْغَـدَاةِ وَالْعَشِـيِّ، إِنْ كَـانَ مِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّـةِ فَمِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّـةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّـارِفَمِنْ أَهْلِ النَّـارِ، فَيُقَـالُ : هَـذَا مَقْعَـدُكَ. حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتـــای فەرمـــوودەکە** ﴿ بێگومـان ئەگەر یەکێـک لە ئێـوە مرد ئەوە شـــوێنی خـــۆی نیشـــان دەدرێ هەمـــوو بەیـــانی و ئێـــوارەیەک، ئەگەر مـــردووەکە ئەهلـی بەهەشـــت بـــوو ئەوە شـــوێنەکەی خـــۆی نیشـــان دەدرێـــت لە بەهەشـــت، وە ئەگەر ئەهلـــی دۆزەخ بـــوو ئەوە شـــــوێنەکەی لەدۆزەخ نیشـــــان دەدرێ، جـــــا دەوترێـــــت ئەوە شـــوێنەکەتە تـــا ئەو کـــاتەی اللَّه تَعـــالَى زینـــدووت دەکـــاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ﴾

## واتای وشەکان

إِنَّ أَحَدَكُمْ : بێگومان یەکێک لە ئێوە

إِذَا مَاتَ : ئەگەر مرد





عُـــرِضَ عَلَيْـــهِ : نيشـــانى دەدرێـــت، نيشـــانى مـــردووەكە دەدرێ هائەكە بۆ ماتَ دەگەڕێتەوە

مَقْعَـدُهُ : شـــوێنەكەى، شـــوێنى دانيشـــتنى، هـــائەكە دەگەڕێـــتەوە بۆ ماتَ

بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ : لە بەيانى و ئێوارە

إِنْ كَانَ : ئەگەر مردووەكە بوو

مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ : لە دانيشتووى بەهەشت، لە ئەهلى بەهەشت

وَإِنْ كَانَ : وە ئەگەر مردووەكە بوو

مِنْ أَهْلِ النَّارِ : لە دانيشتووى ئاگرى دۆزەخ ، لە ئەهلى ئاگر

فَيُقَالُ : جا دەوترێت

هَذَا مَقْعَدُكَ : ئەوە شوێنى تۆيە ، ئەوە شوێنى دانيشتنى تۆيە

حَتَّى : هەتا، تا ئەوكاتەى

يَبْعَثَكَ اللَّهُ : اللَّه زيندووت دەكاتەوە

يَبْعَثَكَ : زيندووت دەكاتەوە

يَوْمَ الْقِيَامَةِ : ڕۆژى قيامەت







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْ نِفَاقٍ حَتَّى يَدَعَهَا، إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ﴾ مُتَّفَقٌ عليه

**واتای فەرموودەکە** ﴿چوار سیفەت هەیە هەر کەسێک تێیدا بێت ئەوە دووڕوویەکی تەواوە، وە هەر کەسێک دانەیەک یان سیفەتێکی لەو چوار سیفاتەی تێدابێت، ئەوە بەشێک لە دووڕوویی و نیفاقی تێدایە تائەوکاتەی وازی لێدەهێنێت، ئەگەر قسە بکات درۆ دەکات، وە ئەگەر پەیمانێک ببەستێت غەدر دەکات و هەڵیدەوەشێنێتەوە، وە ئەگەر بەڵێن بدات سەرپێچی دەکات، وە ئەگەر توشی کێشە و دەمەقاڵێ بوو لەحەق لا دەدات و قسەی خراپ دەکات﴾



## واتای وشەکان

أَرْبَعٌ : چوار( سیفەت و ڕەوشت هەنە )

مَنْ كُنَّ فِيهِ : هەرکەسێک ئەو چوارەی تێدابوو

فِيهِ : ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ مَنْ

كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا : ئەوە دووڕوێکی تەواوە

وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ : وە ئەگەر کەسێک ڕەوشتێکی تێدابوو، جەمع و کۆی خَلَّةٌ بریتییە لە خِلال

مِنْهُنَّ : لەو چوار سیفەت و ڕەوشتە، هُنَّ دەگەڕێتەوە بۆ أَرْبَعٌ

كَانَتْ فِيهِ : ئەوە تیایەتی ئەو کەسە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ مَنْ

خَلَّةٌ : سیفەتێک، ڕەوشتێک، خەسڵەتێک

مِنْ نِفَاقٍ : لە دوڕوویی

حَتَّى : هەتاوەکو

يَدَعَهَا : وازی لێ دەهێنێ، تاوەکو واز لەم سیفەتە دەهێنێت، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ خَلَّةٌ

إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ : ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات



وَإِذَا عَاهَـدَ غَـدَرَ : ئەگەر پەیمـانی بەسـت غەدر دەکـات، پەیمـان هەڵدەوەشـێنێتەوە، وازی لـێ دەهێنێـت، بـۆ نمـونە بەکەسـێک دەڵێـت: ( ئەگەر فـلان کـارم بـۆ بکەیـت مـن لێـت خـۆش دەبـم، بەڵام دواتریش لێی خۆش نابێت )

وَإِذَا وَعَـدَ أَخْلَـفَ : ئەگەر بەڵێنـی دا سـەرپێچی دەکـات، جـێ بەجێی ناکات، دەیشکێنێت

وَإِذَا خَاصَـمَ فَجَـرَ : ئەگەر تووشـی کێشـە بـوو لەحەق و ڕاسـتی لا دەدات( لێـرە مەبەسـت لەوەیە ئەگەر توشـی نـاکۆکی بـوو جنێـو دەدات و قسەی ناشرین و نابەجێ و بوختان دەکات )







قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ ﴾ رواه البخاري

**واتای فەرموودەکە** ﴿ هیچ یەکێک خواردنێکی نەخواردووە هەرگیز باشتربێت لەوەی دەیخوات لە کارکردنی دەستی خۆی، وە بێگومان پێغەمبەری الله داود علیه السلام، خواردنی کاری دەستی خۆی دەخوارد "کە ئاسنگەری بوو ﴾

## واتای وشەکان

مَا أَكَلَ : نەیخواردووە

أَحَدٌ : یەکێک، کەسێک

طَعَامًا : خواردنێک

قَطُّ : هەرگیز





خَيْرًا : باشتر

مِنْ أَنْ يَأْكُلَ : لەوەی دەیخوات

مِنْ عَمَلِ يَدِهِ : لە کارکردنی دەستی خۆی

وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ : وە بێگومان پێغەمبەری اللَّه

دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ : داود علیه السلام

يَأْكُلُ : دەیخوارد

مِنْ عَمَلِ يَدِهِ : لە کارکردنی دەستی خۆی

سوپاس بۆ اللَّه تَعالَی کۆتایی هات لە

٢/ذو القعدة/١٤٤٤ هـ

٢١/٥/٢٠٢٣ م

شەوی دووشەممە





# تەواوی چل فەرموودەکان

- بُنـــِيَ الْإِسْـــلَامُ عَلَـــى خَمْـــسٍ : شَـــهَادَةِ أَنْ لَا إِلَـــهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّـــدًا رَسُـــولُ اللَّهِ، وَ إِقَـــامِ الصَّـــلَاةِ، وَ إِيتَـــاءِ الزَّكَـــاةِ، وَالْحَـــجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ

- خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ

- إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ

- اللَّهُمَّ باسْمِكَ أَحْيا و أمُوتُ

- اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ

- مَـــنْ تَوَضَّـــأَ، فَأَحْسَـــنَ الْوُضُـــوءَ خَرَجَـــتْ خَطَايَـــاهُ مِـــنْ جَسَـــدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ

- وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ

- تَبْلُغُ الْحِلْيَةُ مِنَ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الْوَضُوءُ







- إنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلَاتُهُ، فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَ أَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ

- مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللَّهِ

- بَشِّرِ المشَّائينَ في الظُّلَمِ إلى المَسَاجدِ بالنُّورِ التَّامِّ يومَ القيامةِ

- إنَّ أَعْظَمَ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلَاةِ أَبْعَدُهُمْ إِلَيْهَا مَمْشًى فَأَبْعَدُهُمْ

- مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ، فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ، فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ

- إنَّ مِنْ أفضلِ أيَّامِكُم يومَ الجُمعةِ، فأكْثِروا عليَّ منَ الصَّلاةِ فيهِ، فإنَّ صَلاتَكُم مَعْروضَةٌ عليَّ

- خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ؛ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا







- الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ

- لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا صُورَةٌ

- لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ

- الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ

- يَا غُلَامُ، سَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ

- الِاسْتِئْذَانُ ثَلَاثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ وَإِلَّا فَارْجِعْ

- يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ

- نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا شَيْئًا فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ





- سَـأَلْتُ النَّبـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: أَيُّ الْعَمَـلِ أَحَـبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قَـالَ: الصَّـلَاةُ عَلَـى وَقْتِهَـا " قَـالَ: ثُـمَّ أَيٌّ؟ قَـالَ: ثُـمَّ بِـرُّ الْوَالِـدَيْنِ " قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

- حُرِّمَ لِبَاسُ الْحَرِيرِ، وَالذَّهَبِ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي، وَأُحِلَّ لِإِنَاثِهِمْ

- إنَّ مِن خيارِكُم أَحْسَنَكُم أَخْلاقًا

- أَنَـا سَـيِّدُ وَلَـدِ آدَمَ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ، وَأَوَّلُ مَـنْ يَنْشَـقُّ عَنْـهُ الْقَبْـرُ، وَأَوَّلُ شَافِعٍ، وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ

- لَا يُـؤْمِنُ أَحَـدُكُمْ حَتّـَى أَكُـونَ أَحَـبَّ إِلَيْـهِ مِـنْ وَالِـدِهِ وَوَلَـدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ

- مَنْ رَآنِي فِي المَنامِ فقَدْ رَآنِي؛ فإنَّ الشَّيْطانَ لا يَتَمَثَّلُ بِي

- كُلُّ أُمَّتي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ إلَّا مَن أَبَى، قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَن يَأْبَى؟ قالَ: مَن أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَن عَصَانى فقَدْ أَبَى





لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا مِنْ أُمَّتِي خَلِيلًا لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ، وَلَكِنْ أَخِي وَصَاحِبِي

أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ، وَأَشَدُّهُمْ فِي أَمْرِ اللَّهِ عُمَرُ، وَأَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ، وَأَعْلَمُهُمْ بِالْحَلَالِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَ أَفْرَضُهُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَ أَقْرَؤُهُمْ أُبَيٌّ، وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينٌ، وَأَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ

مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ

سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ " قَالُوا: وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ

لَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَدَابَرُوا ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ

عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ؛ فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا. وَ إِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ؛ فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا



مَـنْ كَـانَ يُـؤْمِنُ بِـاللَّهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ فَـلَا يُـؤْذِ جَـارَهُ، وَمَـنْ كَـانَ يُـؤْمِنُ بِـاللَّهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ فَلْيُكْـرِمْ ضَـيْفَهُ، وَمَـنْ كَانَ يُـؤْمِنُ بِـاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ

إِنَّ أَحَـدَكُمْ إِذَا مَـاتَ عُـرِضَ عَلَيْـهِ مَقْعَـدُهُ بِالْغَـدَاةِ وَالْعَشِـيِّ، إِنْ كَـانَ مِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّـةِ فَمِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّـةِ، وَإِنْ كَـانَ مِـنْ أَهْـلِ النَّـارِ فَمِـنْ أَهْـلِ النَّـارِ، فَيُقَـالُ : هَـذَا مَقْعَـدُكَ. حَتَّـى يَبْعَثَـكَ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

أَرْبَـعٌ مَـنْ كُـنَّ فِيـهِ كَـانَ مُنَافِقًـا خَالِصًـا، وَمَـنْ كَانَـتْ فِيـهِ خَلَّـةٌ مِنْهُنَّ كَانَـتْ فِيـهِ خَلَّـةٌ مِـنْ نِفَـاقٍ حَتَّـى يَـدَعَهَا، إِذَا حَـدَّثَ كَـذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ

مَـا أَكَـلَ أَحَـدٌ طَعَامًـا قَـطُّ خَيْـرًا مِـنْ أَنْ يَأْكُـلَ مِـنْ عَمَـلِ يَـدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَد

تمت





# فهرس